# وەرگێڕان هونەرە

نووسینی: جەمال نەبەز

زنجیرەی
نووسینی کوردیی نوێ و،
ژیاندنەوەی میراتی نەتەوایەتیمان
-٤-

ئەم نامیلکەیە سەرنجێکی سەرپێییە لە هونەری وەرگێڕان.
یارمەتی ئەو کەسانە دەدا کە دەیانەوێ
لەم سووچەوە خزمەتی زمانەکەمان بکەن

**چاپی یەکەم:**
**چاپخانەی ژین**
**ساڵی ٢٦٥٨ی کوردی (١٩٥٨ی ز) سلێمانی**

**چاپی دووەم:**
**ساڵی ١٩٧٢ - ١٩٧١**
**لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی بەشی کوردی، کۆلیجی ئادابی زانستگەی بەغدا**

**چاپی سێیەم:**
**ساڵی ١٩٨٦**
**ستۆکهۆڵم - سوێد.**

**چاپی چوارەم:**
**نەورۆزی ٢٧٠٨ی کوردی (April 2008) ی زایینیی**
**لە بڵاوکراوەکانی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان (دەزگەی راگەیاندن)**

**"تایپ و مۆنتاژ و ئامادەکردنی بۆ چاپی ئەلیکترۆنی و داڕشتنەوەی بەشێوازی ڕێنووسی ئیمڕۆ، لەلایەن "سیروان کاوسی" یەوە ئەنجامدراوە.**

* * * *

# پەنجا ساڵ دواتر
# چەند وشەیەک بە بۆنەی
## تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ بەسەر چاپی یەکەمی ئەم نامیلکەیەدا!

**خوێنەرەوەی بەڕێز!**

وەک لە بەرگ و پێشگوتنی ئەم باسەوە دیارە، لەزستانی ساڵی ١٩٥٨ دا، لە بەسرە، نووسیومە، کاتێک لەوێ، لە قوتابخانەی نێوەندیی زۆبێر، مامۆستا بووم. ئەمەش پاش ئەوەی لە قوتابخانە نێوەندییەکانی کەرکووکەوە، بە "فەرمانی بەڕێوەبەرانە" (امر اداری) فڕیدرامە زوبێر. بابەتی ئەوەی چۆن کەوتمە سەر خەریکبوون بە زمانی کوردی وکوردۆلۆژییەوە و، بەرهەمی ئەو ساڵانەم چی بوون، خوێنەروە دەتوانێ، تەماشایەکی "وشەنامەکی ئێتیمۆلۆژیای زمانی کوردی" بکات لە ماڵپەڕی کوردبوون www.kurdbun.com و ماڵپەڕی کۆنگرە www.kncscandinavia.com و ماڵپەڕی کتێبخانەی کوردی www.pertwk.com دا.

پاش کودەتای ژنەراڵ عەبدولکەریم قاسم لە عێراق لە ١٩٥٨/٧/١٤ دا، واتە چەند مانگێک دوای نووسینی ئەم باسە، توانیم لە هاوینی ئەو ساڵەدا، وەک نامیلکە، لە چاپخانەی "ژین" لە سلێمانی بەچاپی بگەیەنم. ڕاستییەکەی، چاپخانەی "ژین"، هەر نێوەکەی چاپخانە بوو، ئەگەرنا هەر کەسێک چاپی یەکەمی "وەرگێران هونەرە" ی چاوپێکەوتبێ، بەباشی بارودۆخی چاپخانەکانی ئەو سەردەمەی باشووری کوردستانی دێتە بەرچاو. درێژەی ئەم باسەش لە "خوێندەواری بەزمانی کوردی" دا دەستدەکەوێ، کە لەساڵی ١٩٥٧ دا لە کەرکووک نووسیومە و، هەر لەو ساڵەدا لە بەغدا چاپکراوە (سەرنجی ماڵپەڕی "کۆنگرە" بدە).

شایانی باسە، زمانی کوردی لەو سەردەمەدا، زمانی ناپەیداکردن و خۆپێوەبادان نەبوو. ئەوی نانیشی ببوایە و، ئاوڕێکی لەزمانی کوردی بدایەتەوە و خزمەتێکی

بکردایە، بێجگە لەوەی تووشی گەلێک بەرهەڵست و تەگەرە و گەڕ و گێچەڵ دەبووەوە، زۆر جار نانیشی دەبڕا. لەبەر ئەوە کەم کەس هەبوون بوێرن توخنی زمانی کوردی بکەون. ژمارەیەکی زۆر کەم، وەک مامۆستایان مەلا جەمیلی رۆژبەیانی، عەلائەدین سەجادی، گیوی موکریانی، مستەفا نەریمان، رەفیق حیلمی، مارف خەزنەدار و، نووسەری ئەم چەند دێڕە هەبوون، کە سەرەڕای ئەو رەوشە خراپە، بەکوردی دەیاننووسی و بەرهەمەکانیان دەخستە بەردەم خەڵک، دیارە بە ژمارەیەکی کەم، کە لە هەزار دانە تێپەڕینەدەکرد.

لەم چەند ساڵەی دواییدا، گەلێک دۆست و ناسیاو، رووییانناڵیێم، نووسینە کۆن و نوێیەکانم، لەشێوەی "کۆبەرهەم" دا لەچاپبدەمەوە، هەر چەندە یارمەتیدانم بۆ تایپکردن و ئامادەکردنیان زۆر کەمە، لەگەڵ ئەوەشدا، هیوام وایە، تا ماوم هیچ نەبێ بەشێکی ئەو کارانەی بەدەستیانەوە ماندووبوم بکەونە بەردەست ئەوانەی ئارەزووی بینینیان دەکەن. لەم رووەوە، سوپاسێکی گەرمی هاوبیری هێژا، سیروان کاوسی دەکەم کە زەحمەتی تایپکردن و نووسینەوەی دەقی باسەکەی بە ئەلفوبێی نوێی کوردی، کە ئەو دەمە ئەلفوبێی چوکڵەدار لە چاپخانەی "ژین" دا دەستنەدەکەوت، خستە سەرشانی خۆی و، بۆ ئەم چاپە ئەلیکترۆنییە ئامادەی کرد. ئێستە هەر کەسێک بیەوێ، دەتوانێ، چ ئەم بەرهەمە و، چ بەرهەمەکانی دیکەمی، لە چەند ماڵپەڕێکدا، بەخۆڕایی دەستبکەوێ.

**جەمال نەبەز**

**بەرلین:** ٢٠٠٨/٤/١٤

## پێشگۆتنێک بۆ
## چاپی دووەم
## بە پێنووسی دوکتۆر عێزەدین رەسووڵ،
## مامۆستای زمان و وێژەی کوردی لە زانستگەی بەغدا

### قوتابی یە خۆشەویستەکان

بۆ ئەوەی لەبەشی تیۆریی دەرسی وەرگێڕانا زیاد لەوانەی لەدەرس ووتنەوەدا باس کران، شتێکیان لەبەر دەست دابێ، پێویست بە کتێبێک هەبوو کە لە (وەرگێڕان) بدوێ. دانانی کتێب لەماوەی تەنگی ئەم سالەدا شتێکی ئاسان نی یە، بە تایبەتی کە خەریک بوون بە چەند نووسینی ترەوە رێگەی گرتووە. بۆیە هاتمە سەر ئەوەی کورتەی ئەو بیرانەتان بۆ بنووسمەوە کە باس کراون. بەڵام لەمەیان دا هەر چەندم کرد ئەو کورت کراوەیە هەر لەسنووری ئەوەدا ئەمایەوە کە زانای کورد دوکتۆر جەمال نەبەز (١٤) ساڵ لەمەوبەر نووسیوی یەتی. لەبەر ئەوە بڕیاری ئەوەم دا، کە نووسینەکەی ئەوتان سەرلەنوێ بۆ چاپ بکەمەوە.

(وەرگێران هۆنەرە)، هەر چەندە کورتە بەڵام بە یەکێک لە کارە بەنرخ و پەسەندەکانی ئەم نووسەر و زانا کوردە ئەزانرێ، ئەوەشمان لەبیرنەچێ کە ئەم نامیلکەیە کاتێ نووسراوە کە نووسەر هێشتا لە نیشتمان بوو، بۆ خوێندن و فێربوون و بوونە زانا ئاوارەی ووڵاتان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بیری قووڵ و روون و بەنرخی تیایە، بۆ ئەوە ئەگونجێ کە ببێتە سەرەتا و بناغەی باسێکی فراوان دەربارەی (وەرگێڕان لە کوردی دا).

وا چواردەسال رۆیشت و هێشتا ئەو ئاواتەی نووسەر نەهاتۆتەدی کە بزوتنەوەیەکی وەرگێڕاندن پەیدابێ و ببێتە سەرەتای راپەڕینێکی رۆشن بیری. بەڵێ لەپاش نووسینی ئەم نامیلکەیەوە تا ئیستا چەند کتێبی تر کراون بە کوردی و ئەوەش کە دڵ خۆش ئەکا ئەوەیە کە هەندێ لەمانە یەکسەر لەزمانەکانی رۆژئاواوە کراون بە کوردی و هەنگاوێکن بۆ ئەوەی رۆشن بیری ی کوردی لەو چوارچێوەیە رزگار بکەن،

که دەسەلاتی رۆشن بیری نەتەوەی گەورەی ئەو دەوڵەتە دای ئەسەپێنێ که بەشەکەی کوردستانی پێوە بەستراوە، بەڵێ هەر دوکتۆر جەمال نەبەز خۆی لەسەرەتای دەست دانە نووسین دا، بە وەرگێڕانی (گەرداوەکە) ی شکسپیر و (پاڵتۆ) ی (گۆگۆڵ) ئەم دەرگایەی کردەوە. بەڵام ئەمە ئەبێ ببێتە رێبازی ئەمڕۆی وەرگێڕانمان.

بۆ ئەو شتانەی بۆ خوێندەوار و رۆشن بیری کورد وەرئەگێڕڕێن، هیچ پێویست ناکا لە عەرەبی یەوە شت وەربگێڕین. چۆنکە رۆشن بیری کوردستانی عێراق عەرەبی ئەزانن و پێ ویستیان بەوەیە ئاگاداری بیری رۆژئاوا بکرێن و ئێمەش لە بیری رۆژئاوا شتی تایبەتی ی خۆمانمان پێ ویستە کە رەنگە خوێندەواری عەرەب پێ ویستی بەوە نەبێ و شتی تری بوێ. ئەوەش کە بۆ کۆمەڵانی خەڵکە، بۆ کرێکار و جوتیاری کوردە، کە بەشێک لە هوشیارکردنەوەی سیاسی، ئەوە لەهەر زمانێکەوە وەربگێڕڕێ هەر باشە، بەمەرجێ ناوەرۆکەکە باش و سوودمەند بێ و کەڵکی ئەوەی بێ کە رەنج کێشی کورد پێش بخا و رادەی هوشیاری ی بەرزبکاتەوە.

زۆر نەتەوەی جیهان، ئێستا کەوتوونەتە سەر ئەوەی کتێبخانەی تەواو بەزمانی خۆیان دروست بکەن. واتە هەموو بەرهەمی بەنرخی زمانەکانی تر وەربگێڕنە سەر زمانی خۆیان و خوێندەواریان بەزمانەکەی خۆی هەموو شتی لەبەر دەستابێ و بچێتەوە سەر هەموو سەرچاوەیەک. دیارە ئەمە بۆ کورد هێشتا زووە بەداخەوە زۆری ماوە. بۆیە ئەبێ ئێمە لەوەرگێڕانی ئەمڕۆمان دا پلانێکمان هەبێ. کات و ئەرک و پارە و کاغەز بخەینە پێناوی شتێک کە بهێنێ و پڕ بە پڕجێگەی خۆی بگرێ و سوودی بە ئەمڕۆی رۆشن بیری و هوشیارکردنەوەمان هەبێ. دووبارە کردنەوە نەبێ، شتێ نەبێ کە هێشتا لە بازاڕدا بە عەرەبی هەبێ و لە بەردەستی خوێندەوارانا بێ. ئەبێ بە پێ ی پلانی دەربارەی هەموو شتێکی پێ ویست و لە هەموو مەیدانێکی زانستی دا بەرهەم وەرگێڕین. بەمە تەوژمێکی تازە لە نووسین و ئەدەبیات و بیر و زانستمان دا ئەخەینە کار.

ئەوەش کە لە کوردی یەوە وەرئەگێڕڕێتە سەر زمانێکی بێگانە، یا دەربارەی کوردە و کوردێک لە زمانێکی بێگانەوە وەری ئەگێڕێتە سەر زمانێکی تر، ئەوەش هەر ئەبێ لە

سنووری خزمەت کردنی ئەمڕۆی مەسەلەی نەتەوەی کوردی سەرفراز و قارەمانمان دا بێ و کەڵکی بۆ ئەو مەسەلەیە هەبێ. ئەگینا ڕەنگە بە خۆ خەریک کردنێکی بێ سوود بژمێررێ. بەڵێ – جاری واهەیە پیاوی زانا و نووسەر چوارچێوە و سنووری لاتەنگ و ناخۆشە و حەز بە نەهێشتنی ئەکا و تەنیا خزمەتی زانست و هونەری ئەوێ. بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە زانا و نووسەر و هونەرمەند ئادەمیزادن و ئەرکیان بە سەرشانەوەیە و هەر یەکەش ڕۆڵەی نەتەوەیەکن. زانا و هونەرمەند و نووسەری کورد ئەمڕۆ ئەرکیکی گرانیان بەسەر شانەوەیە و ئەبێ بە جێ ی بێنن. خزمەتی نەتەوەی کوردیش، پەل گرتنی، داڕماندنی کەڵەکەی دواکەوتنی چەند سەدەی ژیانی، خزمەتێکی گەورەی زانست و ئەدەبیات و هونەر و جوانی و مرۆڤایەتی یە و ئەبێ ڕۆشن بیری کورد لەم چوارچێوەیەوە دەست پێ بکا و لێرەوە بچێتە ناو ئاسۆی فراوانی زانست و هونەر و جیهانەوە.

دوا وشە - با لەچاپدانەوەی ئەم چەند لاپەڕەیە، بۆ ئێوە و بەم چەشنە، یادکردنەوەیەکی بچووکی نووسەرەکەی بێ و هیوای قووڵ و دڵسۆزانەی لەسەر ڕۆیشتن و فراوان کردنەوە و زۆرترکردنی ئەو خزمەتە بەنرخ و گەورانەبێت، کە لەو وولاتە دوورەوە جوامێرانە پێشکەشی نەتەوەی کورد و زانستی ی ئەکات.

**دوکتۆر عێزەدین ڕەسووڵ**
**بەغدا – ١٩٧٢/٤/٢٧**

**سەرنج:**

**پێشگۆتنەکەی بەڕێز دوکتۆر عێزەدین ڕەسووڵ هەرووەک خۆی چاپکرایەوە، بێ هیچ دەستکارییەکی ڕێنووسەکەی، کە ڕێنووسی (٣٦) ساڵ لەمەوبەری نووسەرانی کوردی باشووری کوردستان بوو.**

**ئامادەکەری "وەرگێڕان هونەرە" بۆ چاپ**
**نۆرویژ ٢٠٠٨/٥/٢٥**
**سیروان کاوسی.**

# وەرگێڕان هونەرە

## سەرەتا

وەرگێڕان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە هونەرێکە بۆخۆی، هیچ کەمترنییە لە چیرۆکنووسین و شیعرگوتن و رەخنەگرتن. کە واتە، ئەوەی پارچە نووسینێک وەردەگێڕێ، دەبێ دەستێکی باڵای هەبێ لە هونەری وەرگێڕاندا، ئەگینا لە کارەکەیدا سەرکەوتوونابێ. بێگومان هەر کەسێکی نەشارەزا، ئەگەر کامێرایەکی بدەیتەدەست و پێی بڵێیت بەرامبەر شوێنێکی راگرێ، ئەوجا دەستبنێ بە دوگمەیەکی تایبەتدا، پێیدەکرێ وێنەی ئەو شوێنە بگرێ، بەڵام هەموو وێنەگرێک ناتوانێ وێنەیەکی جوانی رێکوپێکی هونەرمەندانە بێنێتەدەرێ، ئەوانە نەبێ کە دەستیان تێیدا قاڵبووە و، بەتاقیکردنەوەیەکی دووروودرێژدا تێپەڕیون. هەروەها وەرگێڕانیش کە یەکێکە لە هونەرە بەرزەکان، وەنەبێ هەرچ کەسێ هەستا و دەستیدایە قەڵەم، بتوانێ بەسەریدا زاڵبێ، بەڵکو ئەمەیش وەک وێنەگرتنەکە دەستێکی وەستایانە و خەریکبوونێکی زۆری دەوێ. لەبەر ئەوە، وەک هەموو هونەرێکی دیکە، پێویستی بە بەهرەیەکی خواکرد هەیە. لەپاڵ ئەوەشدا، وەرگێڕانی باش ئەوەیە چەند شەرتێکی تێدا کۆبێ و، لەسنووری ئەو دەستوورەدا کە بۆیدانراوە، دەرنەچێ. جا مەبەستم لەم نامیلکە کورتە ئەوەیە، ئەو دەستوور و شەرتانە بخەمە بەرچاوی ئەوانەی بەتەمان لەم سووچەوە خزمەتی زمانە هەژارەکەمان بکەن، تاوەکو بە پێڕەویکردنی ئەو رێیانە بتوانن ئەو شتەی بۆمان وەردەگێڕن، لە قاڵبێکی خۆماڵی و شێوەیەکی جوان و رەواندا پێشکێشی بکەن.

بەڕاستیی، هیچ نەتەوەیەک نییە بتوانێ واز لەوەرگێڕان بهێنێ، هەرچەندە سامانێکی نەتەوایەتیی کۆن و بەنرخیشی هەبێ — چۆنکە هەر وەرگێڕانە دەبێتە هۆی ئەوەی گەلێک ئاشنای شارستانێتی و زانیاری و ئەدەبیاتی گەلێکی دیکە بێ، بێئەوەی ناچاربێ بەفێربوونی زمانەکەی — نەخوازەلا ئێمەی کورد کە بووینەتە قرەی کاروانی گەلان، پێویستییەکی تەواومان هەیە بە وەرگێڕان. بەجۆرێک دەتوانم بڵێم، دەبێ راپەڕینی

هزریی پاشەڕۆژمان، تا رادەیەکی بەرز لەسەر بنچینەی وەرگێڕان دابمەزرێنین. هەرچەندە، جێی سوپاسە، وا لەم رۆژانەی دواییدا، نووسین و بڵاوکردنەوە و، چاپ و چاپگەری لەچاو جاراندا بووژاونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، نابێ بەم چەشنە (وەرگێڕان) بخرێتە پشتگوێ و کەس نەچێ بەلایدا. بەڵکو بەلای منەوە و، بەتایبەتیی لەم پلەیەدا، گەلێ لە دانان (تألیف) گرنگتر و کاریگەرترە بۆ ئێمە (١*) و، هەر دەبێ لەڕێگەی پەیداکردنی ئاشنایەتییەوە لەگەڵ وێژە و زانیاریی گەلە پێشکەوتووەکان، بناخەی وێژەیەکی زیندووی نوێ و بنچینەی کۆشکێکی زانیاریی بۆ خۆمان بنیات بنێین.

ئەگەر سەرنجێکی ئەو راپەڕینە نەتەوەییانە بدەین کە تا ئێستە بەدرێژایی مێژوو روویانداوە، دەبینین وەرگێڕان دەورێکی گەورەی تێداگێڕاون. بۆ نموونە: عەرەبەکان لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتیدا، بە گەرمییەوە دەستیاندایە وەرگێڕانی کتێبەکانی یۆنان و رۆمان و سریان و هێند و فارس بۆ زمانی عەرەبی (٢*) و، بەم هۆیەوە توانییان دەسمایەیەکی زانستی و ئەدەبیی بەنرخ بۆ خۆیان پێکەوە بنێن. ئەورۆپاییەکانیش لەسەتەکانی نێوەڕاستدا، بەشێک لەمیراتی نەتەوایەتیی عەرەب و ئێرانییەکانیان وەرگێڕایە سەر زمانەکانی خۆیان، بەوە مەشخەڵی شۆرشی هزرییان بەرەو پێشەوە برد.

ئێمەی کوردیش کە بەهۆی باری ناهەمواری ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، سەبارەت بە تینەکۆشین و سنگنەدانە پێشەوەی خۆمانەوە، لە هەموو خێروبێرێکی مرۆڤایەتیی بێبەشکراوین و، لە سەرتاسەری وڵاتی فراوان وگەورەماندا، بەتاقی تەنێ لە باشووری کوردستاندا، لەباتی هەموو مافێک، لەسنوورێکی یەکجار تەنگ و کەمدا ماوەی نووسین و خوێندمان بە زمانەکەمان دراوەتێ، پێویستە کوردانە قۆڵی لێهەڵبکەین و، هەتا رادەیەکی زۆر ئەم تۆزە هەلە بەکاربهێنین بۆ نووسینی شتی بەکەڵک و، لەڕێگەی پێکهێنانی هەرەوەزێکی گشتییەوە، یادگارە بەسوودەکانی بێگانە وەرگێڕینە سەر زمانەکەمان، بۆ ئەوەی نەک هەر تەنێ بەژێر دوستوپێی گەلە پێشکەوتووەکانەوە نەبین و، بەس، بەڵکو دەرووی راپەڕینێکی نەتەوایەتیی لەخۆمان بکەینەوە.

**هاووڵاتی خۆشەویست!**

لەم سەتەی بیستەمەدا کە هەموو نەتەوەیەک واخەریکە بە ئەوپەڕی ئاواتی خۆی دەگا، لەو سەتەیەدا کە زانیاری و هونەر گەیشتووەتە پایەیەک، خەڵک بەکارەبا و ئەتۆمەوە ناوەستن، واخەریکن دەچنە نێومانگ و ئەستێرەکانەوە، حەیف نییە ئێمە تا ئێستە چاوی خەوالوومان هەڵنەگلۆفتبێ و هۆشیکی نەتەوایەتیمان بەبەردا نەهاتبێتەوە .... ؟! بەڵێ راستە، دەستوپێ بەستراوین و زۆرلێکراوین، چاوترسێنراوین ... بەڵام! ئایا خۆشمان کەم تەرخەم نین؟ ئایا خۆشمان گوناهبارنین؟؟؟ دەبا ئەگەر شتی گەورەمان لەدەستتنایە، بێین ئەم نەختە مافەی بەدەسمانەیەوە بەکاری بهێنین. دە کەواتە با دەستبکەین بە زیندووکردنەوەی زمان و ژیاندنەوەی میرات و بڵاوکرنەوەی بیروباوەڕی چاک و وەرگێڕانی شتی بەکەڵک و ئاواکردنەوەی پەرتۆکخانە چۆڵوهۆڵەکەمان بە چاپکراوی بەنرخ، تا ئەگەر هیچ نەبێ، بتوانین لەباری خوێندەوارییەوە کەمێ پێشکەوین. ئەوەش بخەینە دڵمانەوە کە هیچ شوورەیەکی ئاسنین و هیچ بەربەستێکی پۆڵایین لەبەر هێرشی راماڵکەری تێکۆشیندا خۆیناگرێ و، پاشەڕۆژیش هەر بۆ کۆڵنەدەرەکانە.

**بەسرە**

**رۆژی هەینی ٢١ی رێبەندانی ٢٥٦٩ی کوردی**

**٣١ی کانوونی دووەم ١٩٥٨ ی ز**

# بەندی یەکەم

## کورد و وەرگێڕان

وەک لە سەرەتای نامیلکەکەدا باسمانکرد، وەرگێڕان دەورێکی گرنگ دەبینێ لە دامەزراندنی بنچینەی سامانی نەتەوایەتی و شارستانێتیدا. ئێمەی کورد بەهۆی ئەوەوە کە دەمێکە کەژاوەی شارستانێتی بەجێی هێشتووین، ناچارین کەڵک لە زانیاری و پێشکەوتنی گەلانی دیکە وەرگرین. لەبەر ئەوە دەبێ زادەی بیریان وەربگێڕینە سەر زمانەکەمان. واتە، دەستبکەین بە وەرگێڕانی بەرهەمی زانا و نووسەر و هەڵبەستڤان و فەیلەسووف و مێژوونووس و رامیاریزانە بەنێوبانگەکانی نەتەوەکانی بێگانە و، هاوکات هەوڵبدەین زمانی کوردیی بکەینە زمانێکی زانیاریی، لەڕێگەی وەرگێڕانی زانیارییە گرنگەکانەوە، وەک کیمیا، فیزیک، ئەستێرەناسی، ماتماتیک، بژیشکی و ... هتد. بەم جۆرە، دەتوانین سامانێکی ئەدەبی و گەنجینەیەکی زانیاریی بۆخۆمان پێکەوە بنێین.

بێجگە لەمانەش، ئێمە ئیمڕۆ لەهەموو شتێ زیاتر، پێویستمان بەوەیە خۆمان بەبێگانە بناسێنین. هاسانترین ڕێگەش بۆ ئەمە ئەوەیە مێژووی پڕ لە شانازی و هەڵبژاردەیەک لە ئەدەبە نەمرەکەمان وەربگێڕینە سەر زمانە زیندووەکان (٣*). هەروەها ژیانی کۆمەڵایەتی و باری سیاسی و ئامانجی گشتیی خۆمان بەزمانە بێگانەکان بڵاوبکەینەوە، تا گەلانی جیهان، بەڕاستی تێمانبگەن و لەناسینماندا بەهەڵە نەچن. دیسان ئەو پەرتۆکانەی لەسەر کورد بەزمانی بێگانە نووسراون و، دەنووسرێن، وەریان بگێڕین بەکوردی، تا لەبیروباوەڕی گەلانی دیکە بەرامبەر بەخۆمان بگەین (٤*). بێگومان دەستدانە کارێکی گرنگی وەک وەرگێڕان، شۆرشێک هەڵدەگیرسێنێ لە هەموو مەیدانێکدا، چۆنکە ئاشنای بیروباوەڕی خەڵک و زانیاریی نوێ و ئەدەبی زیندوو و پوختەی بەرهەمی گەلان و زادەی بیری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی مرۆڤمان دەکات. بەکورتی، دەرگەی ژیانێکی نوێمان بۆ دەنێتە سەر گازی پشت و، دەمانخاتە سەرڕێگەی ڕاپەڕین و خۆناسین. مێژوو گەلێ نموونەی وای تێدایە، ڕاستیی ئەم وتەیەمان بۆدەردەخات. لەوانە شۆرشی زانستی لە ئەورووپا و، بزووتنەوەکانی

گیانی عەرەبپەروەری لەدەوری عەباسییەکاندا، کە هەردووکیان لەئەنجامی وەرگرتنی وێژە و هونەر و زانیاریی نەتەوە پێشکەوتووەکانەوە روویاندا.

**جا ئێستە با ئەم پرسیارە لەخۆمان بکەین:**

**ئایە ئەم وەرگێڕانە کێ بیکا و چۆن بکرێ؟!**

بۆ وەرامدانەوەی ئەو پرسیارە، دەڵێم هەرکەسێ ئەم کارەی لەوزەدایە، دەبێ قۆڵی لێ هەڵبکا و درێخی نەکا. بەڵام ئایە هەموو وەرگێڕانێک بەتەنیا باڵ دەکرێ؟

بێگومان نەء ..... چۆنکە با ئێمە بڵێین یەکێک دەیەوێ پەرتۆکێکی ئابووری، یان سیاسی، یان کیمیا، یان بژیشکی بکاتە کوردی، بەرلە هەموو شتێک ژمارەیەکی زۆر (مصطلحات) ی زانیاری دێتە رێی کە بەدەستیانەوە دۆشدادەمێنێ و، نازانێ چۆنیان بکاتە کوردی (٥*). لەبەر ئەوە، ئەو وەرگێڕانەی دەیکا، بەجۆرێ کاڵ و کرچ دێتە دەرەوە کە سنووری کەڵکوەرگرتن بەجارێ بەرتەسک دەبێتەوە. بۆیە پێویستە بیر لەرێیەکی دیکە بکرێتەوە، ئەوەش دامەزراندنی ئەکادیمییەکە بۆ کورد (٦*). ئەکادیمییەک کە پێکهاتبێ لە زانایان و شارەزایانی زمانی کوردی لەهەموو شێوەیەکدا، بە مەرجێ ئامانجیان ئەوەبێ ئەو "مصطلحاتە" زانیاری و ئەدەبیانەی تا ئێستە لە کوردیدا بەکار نەهێنراون، یان نەبیستراون، دایانرێژن و بیانهێننە کایەوە. هیچ گومانی تێدا نییە، ئەو وشانەی ئەمانە دروستیدەکەن، گەلێ باشتر و جێگیرتر دەبێ لەوەی هەرکەسە بەکەیفی خۆی هەستێ و شتێک دابنێ، با ئەو کەسە دانا و شارەزاش بێ.

جا ئەمانەش، پاش ئەوەی لەسەر (مصطلحاتەکان) رێکدەکەون، بەکۆمەڵ، یان یەک یەک، دەستبکەن بە وەرگێڕانی بەرهەمە بەنرخەکانی بێگانە.

## بەندی دووەم

### وەرگێڕان دەبێ چۆن بێ؟

**هەموو وەرگێڕێکی باش، دەبێ چەند شەرتێک هەیە تێیدا بێت!**

(١) – وەرگێر وەک هەموو هونەرمەندێکی دیکە، پێویستییەکی تەواوی بە بەهرەیەکی خواکرد و دەستێکی هونەرمەندانە هەیە. ئەم بەهرەیەش بە مەشق (تەمرین) کردن و تاقیکردنەوەی زۆر، گەشە دەکات.

(٢) – دەبێ وەرگێڕ شارەزاییەکی تەواوی لەزمانی کوردی و ئەو زمانە بێگانەیەدا هەبێ کە وەریدەگێڕێ، تاکو بتوانێ بەشێوەیەکی "ئەمینانە" هەرچی بیر وزانستییەک هەیە، بیکا بە کوردی.

(٣) – دەبێ دەستێکی باڵای لەو بابەتەدا هەبێ کە وەریدەگێڕێ. چۆنکە وەنەبێ هەرکەسێ تەنێ شارەزای دووزمان بێ، بتوانێ ئەم کارە بگرێتە ئەستۆی خۆی. بۆ وێنە نووسەرێکی کورد ناتوانێ پەرتۆکێکی ئابووری، یان فیزیک لە ئینگلیزییەوە، یان لە عەرەبییەوە بکا بە کوردی، هەرچەندە شارەزای زمانی ئینگلیزی و عەرەبی بێ. چۆنکە سەری لەو زاراوە (مصطلحاتە) زانستییانە دەرناچێ کە لە ئابووری و فیزیکدا هەن. هەروەها، زانایەکی کیمیا، یان بایۆلۆجی (علم الحیوان) پێی ناکرێ وەک مێژوونووسێک، پەرتۆکێکی مێژوویی وەربگێڕێ، چۆنکە هەر کەسە لە بوار و سنووری پسپۆڕیی خۆیدا دەستیدەڕوا.

## بەندی سێیەم

### وەرگێڕان چەند چەشنە؟

**وەرگێڕان گەلێ چەشنی هەیە، گرنگەکانی ئەمانەن:**

(١) - وەرگێڕان وشە بەوشە: - ئەوەیە، وشە بەوشە زمانێک وەربگێڕینە سەر زمانێکی دیکە، بێئەوەی گوێبدەینە سروشتی تایبەتی ئەو دوو زمانەجیاوازە. لەم حاڵەتەدا وەرگێڕ ناچاردەبێ خۆی ببەستێ بە ریزی وشەکانەوە، پێ بەپێی دەقەکە (٧*). بۆیە بەزۆری نووسینەکە ناڕەوان وپچڕپچڕ دەردەچێ و، ئەمەش یەکێکە لەخراپییەکانی ئەم چەشنە وەرگێڕانە - چۆنکە هەندێ وشە و "تەعابیر" لەزمانێکدا، ئەگەر پێشخرا، بۆی هەیە، لەزمانێکیکەدا دوابخرێ. بێجگە لەمەش، گەلێ جار وەرگێڕان بەوە جوان دەبێ کە هەندێ شت لە (ئەصلە) کە لاببرێ، یان بخرێتە سەری. بەڵام کە بەپێی ریز وەرتگێڕا، ناتوانی کەم و زۆر دەسکاری بکەیت. هەر لەبەر ئەمەیە لەوەرگێڕانی وێژە زیندووەکانی بێگانەدا پێڕەویی ئەم جۆرە وەرگێڕانە ناکرێ. بەڵام لە گۆڕینی دەقی قانونی و بازرگانی و بابەتی ئاینیدا، وەک "قورئان و ئینجیل"، بەکار دەهێنرێت.

(٢) – وەرگێڕان بەدەستکارییەوە : - ئەوەیە، وەرگێڕ خۆی نەبەستێ بەڕیزی وشەکانی (ئەصلە) وە، بەڵکو تەنێ مانا گشتییەکەی وەربگێڕێ. واتە، چەند واتە و وشەیەکی زیاد بۆ ئاشکراکردن بخاتە گۆڕاوەکەوە کە لە "ئەصلە" کەدا نەبێ، یان ئەو شتەی باسکردنی بەپێویست نازانێ لایبەرێ و، بیخاتە پشتگوێ. ئەم چەشنە وەرگێڕانە، بەزۆری بۆ چیرۆک و رۆمان و مێژوو بەکاردەهێنرێ، بەڵام لەشێوازی زانیاریدا ئەوەندە گوێی نادرێتێ. دیارترین خەوشی ئەمەیش ئەوەیە، هەندێ جار، وەرگێڕ وشەیەکی وای لەبیردەچێ کە دەشێ ئەو وشەیە کلیلی (فەقەرەیەکی) تایبەتیی بێ. هەندێ کەس دەڵێن، لەوەرگێڕانی بەدەستکاریدا، دەبێ وەرگێڕ (ئەصڵە) کە مشتوماڵ بکا و چاکی بکا. هەندێکی دیکەش دەڵێن، ئەگەر دەقەکە هەڵەشی تێدابێ، نابێ راستی بکاتەوە.

باشترین رێگە لەنێوان ئەم دوو رێیانەدا ئەوەیە، وەرگێڕ بیروڕای خۆی لە "پەراوێز" دا باسبکات.

وەرگێڕان بەدەسکارییەوە دوو جۆرە: -

(أ) – وەرگێڕان بەفراوانکردن: ئەوەیە وەرگێڕ نەختێ "دەقە ئەصلەکە" فراوانتر بکات و، هەتا دەتوانێ بە کوردییەکی سادە و ڕەوان "تەعبیر" ە شاراوەکانی ئاشکرا بکات. ئەم جۆرەش کاتێ بەکاردێ کە بمانەوێ "دەقێکی" کۆن بەزمانێکی سووک و هاسان وەربگێڕین، یان هەڵبەستێک لەشێوەی پەخشاندا بکەین بە کوردی.

(ب) – وەرگێڕان بە کورتکردنەوە: – ئەوەیە، پوختەی باسەکە بگیرێ و بکرێتە کوردی. واتە هەرچی رستە (جملة) و واتەی پێویست و بەکەڵکە بنووسرێ و، هەرچی زیادەیە و توێکڵە فرێبدرێ، تاوەک ئەو تەلگورافەی لێدێ کە بۆ یەکێک لێدەدری، یان وەک ئەو پڕۆپاگەندەیەی بۆ کۆتاڵێک دەکرێ، کە لە وشەی جەوهەری بەولاوە هیچی دیکەی تێدانابێ (٨*).

٣- وەرگێڕان بە ئیلهامەوە: – لیرەدا وەرگێڕ بەجارێ خۆی نابەستێ بە دەقەکەوە، بەڵکو تەنێ راستە هزرەکە لە نووسەرەکە وەردەگرێ و، ئەوسا هەمووی بە شێوازی خۆی دەنووسێ، بێئەوەی گوێبداتە ریزی وشە و رستە و پاش و پێشخستنی واتەکان. بەجۆرێک وا لەو پارچەیە دەکات، کە یەکێک خوێندییەوە، وابزانێ زادەی بیرێکی بێگانە نییە، بەڵکو لە قاڵبێکی کوردیی خۆماڵییەوە هاتووەتە دەرەوە. پێڕەویکردنی ئەم چەشنە زۆر پێویستە لەوەرگێڕانی ئەدەبە زیندووەکاندا بۆ کوردی.

## بەندی چوارەم

### چۆن پارچەیەك نووسین وەردەگێڕدرێت؟!

مەبەست لەوەرگێڕان، ئەو هونەرەیە کە بەهۆیەوە، وشە و مانا و شێوازی نووسەرێک لەزمانێکەوە بخرێتە سەر زمانێکی دیکە، بەجۆرێک، ئەوی دەیخوێنێتەوە وەک یەک، هەست بە تاموتینیان بکەن. جا بۆ ئەوی پارچەیەک نووسین لەزمانیکی بێگانەوە بگۆڕدرێتە سەرزمانی کوردی، پێویستە وەک هەموو وەرگێڕێکی باش ئەو

شەرتانەی باسمانکرد تێیدابێ. بێجگە لەوەش دەبێ پێڕەوی ئەم چەند دەستوورەبکات، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

(١) – بەر لەهەموو شتێک ئەو پارچەیە بەوردی چەند جارێک بخوێنەرەوە و، تێکڕا لەماناکەی بگە. ئەوجا وشە قورسەکانی جیا بکەرەوە و، ماناکانیان لە لایەکەوە بنووسە، بەتایبەتیی "فعل" ەکان (٩*).

(٢) – دەستبکە بە وەرگێڕانی پارچەکە و ڕست ڕست بیاننووسە.

(٣) – گوێ مەدەرە زنجیرەی ریزی وشە "ئەسڵییەکان"، بەڵکو بەپێی پێویست، وشەکان پاش و پێش بخە. چونکە هەندێ واتە لەزمانی بێگانەدا، ئەگەر پێشبخرێ، ڕەنگە لەکوردیدا دوابخرێ، هەروەها ئەوەی لەزمانێکی بێگانەدا پێویستە دوابخرێ، بۆی هەیە لەکوردیدا پێشبخرێ. بۆ وێنە لەعەرەبیدا دەڵێت: "اكتب الرسالة". لێرەدا فیعلی (اكتب – دەنووسم)، وا لەپێش ناوەکە (الرسالة – نامەکە) وە. جا ئەگەر بەپێی ریزی وشەکان بیکەیتە کوردی، دەبێ بڵێیت: (دەنووسم نامەکە). بەڵام وەرگێڕێکی باش، هیچکات نانووسێ (دەنووسم نامەکە) بەڵکو دەنووسێت: (نامەکە دەنووسم). ناوەکە پێشدەخا و، (بکەر) ەکە دوادەخات. واتە ئەوەی لەعەرەبیدا پێش خرا، پێویستە لە کوردیدا دوابخرێ، بۆ ئەوەی وەرگێڕانەکە ڕەوان دەربچێ. لە ئینگلیزیشدا گەلێ وێنە هەیە بۆ ئەمە، وەک دەڵێیت:

"Iam feeling tired " The man said ". ئەگەر ئەم ڕستەیە بەپێی ریزی وشەکان بکەیتە کوردی، دەبێ بڵێیت: "هەست بە ماندوویەتی دەکەم، پیاوەکە گوتی". بەڵام شتێکی ئاشکرایە، واتەی (پیاوەکە گوتی) لە کوردیدا دواناخرێ، بەڵکو دەخرێتە پێش واتەی (هەست بەماندوویەتی دەکەم) و، دەبێ بڵێیت: "پیاوەکە گوتی، هەست بە ماندوویەتیی دەکەم". ئەوەی لە ئینگلیزیدا دواخرا، لەکوردیدا پێشخرا.

(٤) – بەپێی توانا هەوڵبدە خۆت لە وشەی بێگانە دوور بخەیتەوە. هەمیشە تێبکۆشە کە بەکوردییەکی پەتی و ڕەوان وەریبگێڕیت. بەڵام ئەمە مانای وانییە هەموو وشەیەکی بێگانە هەر فڕێبدەیت ... نەخێر، ئەو وشانەی بەتەواوی لە کوردیدا

تواونەتەوە ، تازە بوون بە هی ئێمە. لەبەر ئەوە بەکارهێنانیان پێویستە. بۆ وێنە ئەو وشانە: بە هیچ کولۆجێک (کل وجە). هەق (حق). ماڵ (مال ١٠*)، نەگبەتی (نکبة)، مرووەت (مرؤة)، ئامشۆکردن (آمد و شدکردن) .... هتد. تازە تێکەڵ بە خوێن و گۆشتی زمانەکەمان بوون. لەبەر ئەوە، بەلای منەوە لابردنیان دەبێتە هۆی پەیداکردنی کەلێنێک کە بە هیچ کولۆجێک بۆمان پڕ نەکرێتەوە. کە واتە، تەنێ مەبەستم ئەوەیە، نەبیت بەو مەلایەی کە بە لای شوانێکدا تێپەڕی، تەماشایکرد شوانەکە شمشاڵێکی زۆر خۆش لێدەدا، کاکە مەلاش پێیگوت: "یا راعی، ئەو صوتە حەزینە کە لەو قصبە مجوفە طویلە ذی الثقوب الکثیرەوە خروج دەکا، بە تحریکی اصابعە عجبایا تەئثیری نەفخی مستمرە؟!". کابرای شوانەش نەختێ داما و، دوایی گوتی: "بیم وەساقەت وەخوا لەزەمان وەسمانلییا ئەسکەریم نەکردووە، لەبەر ئەوە لە ترکی حاڵی ناوم!". بەڵێ، مەلاکەش و شوانەکەش هەردووکیان چەند وشەیەکی عەرەبییان خستە قسەکەیانەوە. ئەوە هەیە وشەکانی شوانەکە لەوانەن کە هەموو کەسێک تێیاندەگا، بەڵام ئەوانەی مەلاکە تەنێ عەرەبیزان سەریان لێدەردەکات.

(٥) – هەتا دەتوانیت، خۆت لە وشەی قورس و نەبیستراو بپارێزە، بەڵکو تا لەوزەتدایە ئەو وشانە بەکار بهێنە کە باون و، هەموو کەس تێیاندەگات. چۆنکە هەتا شێوازی نووسینەکەت هاسان و رەوان بێ، بزانە ئەوە جێگیرتر و نەرمترە. مەبەستم لەوە نییە وشەی شێوەیەک لەشێوەکانی کوردی بەکارنەهێنی، چۆنکە لەنێو خەڵکی ئەو شێوەیەدا کە تۆ پێیدەنووسیت باو نییە، نەء. وا ناڵێم، بەڵکو دەڵێم لەخۆتەوە مەچۆ وشەیەک دروست بکەیت و بەزۆر بیسەپێنی بەسەر خوێنەرەوەکاندا. چۆنکە دروستکردنی وشە، کارێکی ئەکادیمییە، نەک کارێکی تاقە کەسێک. جا دەبێ دان بە خۆتدا بگری، هەتا کۆمەڵێکی زمانەوانیمان دەبێ.

(٦) – هەتا پێتدەکرێ، خۆت تووشی دەردی دووبارەکردنەوە Tautology مەکە. چۆنکە دووبارەکردنەوەی واتە و وشە لە رستەدا، یان لە چەند رستەیەکی نێزیک

یەکدا، شتێکی ناشیرینە. بۆ رزگاربوونت لەمەش، دەبێ لە "موفرەداتدا" زۆر دەوڵەمەند بیت.

## دووبارەکردنەوەش بە دوو چەشنە:

**(أ) – تاقە وشەیەک چەند جارێک لەسەر یەک دووبارەیان بکەیتەوە.**

**(ب) – چەند وشەیەک کە یەک مانا دەبەخشن، یەک لەسەر یەک دووبارەیان بکەیتەوە.**

ئەمەی دووەم پێیدەگوترێ "حەشو". بۆ وێنە: دەڵێیت (هەموو رۆژێک دەچمەلای بەمیوانی، سەری لێدەدەم). واتەی "سەری لێدەدەم"، (حەشو) ە، چۆنکە گوتنی پێویست نییە. مرۆڤ کە چووە لای یەکێک بەمیوانی، مانای وایە بۆ سەرلێدانی چووە و، کە سەری لێدا، مانای وایە بووە بە میوانی.

(٧) – وا چاکترە، ئەوەی وەریدەگێڕیت، لەگەڵ چەند وەرگێڕدراوێکی دیکەدا بەراوردی بکەیتەوە. بۆ وێنە: ئەگەر ویستت پارچەیەک ئەدەبی ئینگلیزی بکەیت بە کوردی، وەرگێڕانی عەرەبی، یان فارسییەکەی لەبەر دەمی خۆتدا دابنێیت باشترە. هەر لەبەر ئەمەشە، یەکێک کە شارەزای چەند زمانێک بێ، توانای وەرگێڕانی زیاترە لەوەی تەنێ دوو زمان دەزانێت.

(٨) – لەشتی ئەدەبیدا، زۆرتر هەوڵبدە، شێوازی دەقەکە و هەستی دەروونیی نووسەرەکە، ون نەکەیت و، ئەوەیش وەرگێڕیت. چۆنکە وەرگێڕان هەر بریتی نییە لە گۆڕینی وشەکان، بەڵکو هاوکات گۆڕینی بیروباوەڕ و هەستی دەروون و شێوازی نووسەرەکەشە. بۆ ئەمەش دەبێ چەند جارێک بەهوردی ئەو نووسینە بخوێنیتەوە تاکو (شێواز) و (نەفسییەتی) نووسەرەکە بەباشی لەناخی دەروونتدا دەچەسپێ. بەتایبەتیی لەوەرگێڕانی هۆنراوەدا دەبێ زۆر وریای ئەمە بیت، چۆنکە لە هۆنراوەدا، نابێ هەر وشەکان وەربگێڕیت و بەس، بەڵکو دەبێ ئاگاداریی مۆسیقای هۆنراوەکەش بکەیت لەکاتی وەرگێڕاندا، چۆنکە، وەنەبێ هۆنراوە، تەنێ چەند وشەیەکی ریزکراوبێ،

نەخێر ... چەشنە مۆسیقایەکیشی لەگەڵە و، دەبێ ئەڵقەی زنجیرەی وشەکانی وا بهۆنیتەوە کە دەنگی ئاوازێکی تایبەتی لێهەستێ. هەر لەبەر ئەوەشە وەرگێڕانی هۆنراوە بەشێوەی (پەخشان)، نەختێ خۆی نییە و، وا پەسندترە هەڵبەستڤان هۆنراوەکە وەربگێڕێ، نەک یەکێکی دیکە (١١*). خۆ ئەگەر هەر ناچار بوویت لەشێوەی (پەخشان) دا وەریگێڕیت، زۆر خۆت مەبەستە بە (دەقەکەوە) و ئامانجی هەرە گەورەت ئەوەبێ، جۆشی دەروونی شاعیرەکە بخەیتە سەر زمانی کوردی و لاسایی ( شێواز) ە کەی بەپێی توانا – و مۆسیقاکەشی بکەیتەوە.

لێرەدا نابێ لەبیرمان بچێ کە هۆنراوەش بەپێی چەشن دەگۆڕدرێ. وەک هۆنراوەی دڵداری و مێژوویی و رامیاری و وەسفی. شارەزایانی هونەری وەرگێڕان دەڵێن، گۆڕینی هۆنراوەی دڵداری لەهەموو چەشنەکانی دیکە زەحمەتترە، چۆنکە دەبێ هەست بە گەرمی ئەو هەڵمەلووکە بکەیت کە لەدەروونی هەڵبەستڤانەوە سەردەکات، ئەگینا تێیدا سەرناکەویت.

(٩) – ئەگەر کەوتیتە سەر ئەوەی پەرتۆکێکی زانیاریی وەک فیزیک، کیمیا، ئەندازە، ئابووری، جەبر .... هتد، بکەیتە کوردی، وامەزانە کارێکی هاسانت لەبەردەمدایە، سەبارەت بەوەی زەحمەت بەدەست شێواز و نەفسییەتی نووسەرەکەیەوە ناکێشی وەک ئەدەبیات، نەخێر .... هەروا سووک نییە، بەڵکو پێویستی بە وردبوونەوە و تێبینییەکی تەواو هەیە لە (تەعبیرکردندا). لەم ڕووەشەوە دەبێ یەکجار وریابیت، چۆنکە (مصطلحات) ی زانیاریت زۆر دێتەڕێ و، زمانەکەشمان وەک ئاشکرایە، لە (مصطلحات) دا هەژارە. بۆیە وای بەباشدەزانم ئەو وشە بێگانانەی لە کوردیدا بەرامبەریان چنگ ناکەوێ، وەک خۆی بیانهێڵیتەوە، هەتا رۆژێ دێ ئەکادێمییەکمان دەبێ. بەڵام ئەگەر هاتو وشەی پڕ بەپری ئەو وشە بێگانانەت دۆزییەوە، قەیناکا بینووسە، بەشەرتێ وشە بێگانەکەش لەنێو دوو کەواندا لەتەنیشتییەوە بنووسی (١٢*).

(١٠) - ئەگەر واتەیەک، یان وشەیەک لە پارچە دەقەکەیدا ماناکەی ئاشکرا و دیار نەبوو، تۆ لەکاتی وەرگێڕاندا لاسایی مەکەرەوە، بەڵکو واتە و وشەی وای بۆ هەڵبژێرە کە هەمووکەس تێیبگات و، ئەگەر پێویستی کرد، لەپەراوێزدا ڕۆنیبکەرەوە.

(١١) - هەموو زمانێک هەندێ واتە و (تەعابیر) ی وای تێدایە کە بەتایبەتیی هی ئەو زمانەیە و، لەزمانەکانی دیکەدا کوتومت بەرامبەری وەک خۆی نییە. جا ئەگەر هاتو تووشی شتێکی لەم بابەتە بوویت، نابێ وشە بە وشە وەریبگێڕیت. خۆ ئەگەر واتکرد، ئەوا شتێکی بێتام و ناڕەوان دەردەچێ. لەبەر ئەوە هەوڵبدە واتە و (تەعابیر) ی خۆماڵییانەی ئەوتۆی بۆ بدۆزیتەوە، ئەگەر پڕ بەپێست خۆیشی نەبێ، هیچ نەبێ نێزیک بێ لێیەوە، هاوکات دەبێ لەتەنیشت ئەو وشەیەوە، وشە بیگانەکەش بنووسرێت، تا بزانرێ بەرامبەر فلانە وشەی بێگانە، فیسارە وشەی کوردیت بەکارهێناوە.

بۆ وێنە: ئەگەر بمانەوێ وشە بە وشەی ئەم رستەیەی خوارەوە بکەینە کوردی:
It rains cats and dogs دەبێ بڵێین: "سەگ و پشیلە دەبارێ". بەڵام ئەگەر بێتو لای هەر کوردێکی نەشارەزا ئەمە بڵێیت، لەوانەیە بەکافرت دابنێ، چۆنکە لەنێو ئێمەدا ئەم (اصطلاحە) بەو چەشنە باو نییە و، لەجیاتی ئەوە "شەست و رەهێڵە" بەکار دەهێنین. بێگومان ئەگەر ئەم "شەست و رەهێڵە" یەی ئێمەش هەر بەوجۆرە بگۆڕێتە سەرزمانی ئینگلیزی، شتێکی واسەیر دەردەچێ، کەس لێی تێناگات. لەهەموو زمانێکدا رستەی لەم چەشنە زۆرن و، ئەم تاقەیەکە بەسە بۆ نموونە.
جا لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە کابرای تایەن، وشەی (نۆکەر) ی کوردی بە "تسعەزماڵ" کردە عەرەبی، پەندێکی وای گێڕا ئەمە (دە) ساڵ زیاترە خەڵک هەر پێی پێدەکەنن.

(١٢) – ئەگەر ئەو شتەی بەدەستتەوەیە، زۆر کۆن بوو، ویستت بەشێوەیەکی ئەمینانەی وا وەریگێڕیت کە خوێنەرەوە تامێکی شێوازی ئەو سەردەمە بکا کە نووسەرەکەی تێدا ژیاوە، نابێ بە شێوازی نووسینی ئیمڕۆ وەریگێڕیت. چۆنکە دەبێ بزانیت، هەر سەتەیەک "تەعابیر" و "مصطلحات" ی خۆی هەیە. زمانیش شتێکی

زیندووه، پێ بەپێی گۆڕانی مرۆڤ و چۆنێتیی ژیان و گوزەرانی دەگۆڕدرێت. بۆیە شێوازی کۆن و تازە زۆر لەیەک جیاوازن و، دەسکاریکردنی "شێواز"، هەندێ جار ناپاکییە لە ئەمانەت. بۆ وێنە، ئەگەر ویستت ئەدەبی "شێکسپیر" بکەیتە کوردی، هەوڵمەدە بەشێوازی ئیمڕۆ وەریگێڕیت، چۆنکە "شێوازی" ئیمڕۆ دەستدەدا بۆ نووسینەکانی "هەمینگوای" و "جۆن پۆل سارتەر" و "ئەهرینبۆرگ" و "شتاینبەک"، بەڵام بۆ "شێکسپیر" و "تاگوور" دەستنادا.

(١٣) – لەشتی ئەدەبیدا ئاگاداری سەرەتای "فەقەرە" و دوا وشەی "فەقەرە" بکە. چۆنکە یەکەم وشە لە "فەقەرە" کەدا سەرنجی خوێنەرەوە رادەکێشێ. وشەی دواییش هەتا ماوەیەک هەر لەگوێدا دەزرینگێتەوە. لەبەر ئەوە دەبێ ئەم دوو وشەیە زۆر بەهێز و کاریگەر بن.

(١٤) – نابێ نوختە (.) و ویرگۆل (،) و تەقەڵ (–) Dash و نیشانەی پرسیار (؟) و نیشانەی سەرسووڕمان (!) و ... هتدت لەبیربچێ، بەتایبەتیی لەشتی زانیاریدا، چۆنکە ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی مانای رستەیەک تێکەڵ مانای رستەیەکی تەنیشت خۆی نەبێ.

(١٥) – بەزۆری هەوڵبدە ئەو وشانە هەڵبژێریت کە لەهەموو شێوەکاندا بەکاردەهێنرێن و، هەموو کوردێک لێیان تێدەگات، چۆنکە ئەو وشانە کە لەنێو گشت نەتەوەی کورددا باون، نەمرتر و جێگیرترن. لەبەر ئەوە دەبێ شارەزاییت لەهەموو شێوەیەکدا ببێت (١٣*).

(١٦) – پاش ئەوەی لەوەرگێڕانی ئەو پارچەیە بوویتەوە کە بە پێی ئەم مەرجانەی سەرەوە وەرتگێڕاوە، بەوردیی سەرلەنوێ پێیدا بچۆرەوە و، بۆ دواجار لەگەڵ (دەقەکەدا) بەراوردی بکەرەوە و، مشتومالێکی دیکەی بکە، ئەوجا بەپێی توانا ئەگەر دوورییەک هەبوو لەنێوانیاندا، لەیەکدییان نیزیک بخەرەوە.

**کۆتایی**

## هاووڵاتیی خۆشەویست!

هەرچەندە وەرگێڕان هونەرێکی قووڵ و فراوانە و، لەوزەی چەند لاپەڕەیەکدا نییە مافی خۆی بداتەدەست، بەڵام من مەبەستم لەوە نەبوو بەتانوپۆی ئەم باسە دوور و درێژەدا بچمە خوارەوە. چۆنکە ئەگەر نیازم وابوایە، نێویم نەدەنا "سەرنجێکی سەرپێیی"، بەڵکو ئەو حەلە لە بەرگێکی گەورەتردا و لەشێوەیەکی پوختەتر و وردتردا گەلێ رووی دیکەم دەخستە بەرچاو، کە ئێستە تەنانەت بە رێڕەویش بەلایاندا نەچووم. ئەوەی راستی بێ، ئامانجی بەرودوام لەم ناملکەیە ئەوەیە، نرخی وەرگێڕان بخەمە پێش چاوی ئەدیب و نووسەرەکانمان و زاتیان بێنمەبەر تا هیچ نەبێ لەم سووچەوە ئاوڕێک لەزمانە بێنازەکەمان بدەنەوە. لاشموایە ئەم چەند لاپەڕەیە سەرباری کەمی و سەرپێی خۆی، وەک کلیلێک وایە بۆ کردنەوەی دەرگەی باسێکی واگرنگ.

هیوام زۆرە خوێنەرەوەی خۆشەویست کەڵکی لێ ببینێ و، بۆ شارەزایی زیاتر، خۆی بگەڕێ بەدوای ئەو سەرچاوانەدا کە بەدووورودرێژی لەم باسەیان کۆڵیوەتەوە.

## خوێنەرەوەی خۆشەویست!

ئێستە پاش ئەوەی لەخوێندنەوەی ئەم نامیلکەیە بوویتەوە، بێگومان ئەگەر تۆش یەکێک بیت لەو خاوەن قەلەمانەی کە لەدەمێکەوە قەڵەمی ناهومێدییان فڕیداوە و، بەدەست بێهیواییەوە دۆشداماون، هەست بەوە دەکەیت کە "ئەرک" پاڵت پێوەدەنێ بۆ دەستدانە قەڵەم و کارکردن. منیش ئەگەر تەنێ ئەوەندەم لەدەست هاتبێ، کارێکی بەکەڵکت بێنمەوە بیر و بتخەمە سەررێگەی خزمەتکردن و تێکۆشین لەپێناوی هێنانەدی ئامانجی گشتیماندا، خۆم بەبەختیارترین کەس دەزانم، چۆنکە خەباتکردن بۆ پێشخستنی زمانی کوردی و ژیاندنەوەی هەستی نەتەوەیی، ئاواتی هەموو کوردێکی بە رۆمەتە.

## سەرنج!

**أ – بۆ نووسینەوەی ئەم نامیلکەیە کەڵک لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە:**

**(١) – فن الترجمة في ضوء الدراسات المقارنة – تألیف الدکتور صفاء الخلوصی – مطبعة دارالمعرفة (بغداد) – ١٩٥٦ م.**

(2) – On the Principles of Translation by; Alexander Fraser Tytler.

**ب – کلێشەی بەرگەکە دەستنووسی کاک (محەممەد فەرەجە). کاک "میدیا" ش لەکاتی چاپکردندا، ئەرکی سەرپەرشتیکردنی گرتە ئەستۆی خۆی. پڕبەدڵ سوپاسی هەردووکیان دەکەم.**

**ج – تکایە چاو لەهەندێ هەڵەی چاپخانە بپۆشن.**

# پەراوێز

(*١) – وەرگێران لەهەموو زانستگە ناسراوەکانی جیهاندا وانەیەکی زۆر گرنگە. لەبەر ئەوە پرۆگرامێکی سەربەخۆی بۆدانراوە و، مامۆستای تایبەتی هەیە دەیڵێتەوە.

(*٢) – بەتایبەتیی لەسەردەمی (مەنسوور) و (مەئموون) دا، گەلێ پەرتۆکی ئەدەبی و فەلسەفی و بژیشکی و کیمیاگەریی لەیۆنانی و هیندییەوە وەرگێردرایە عەرەبی. لە وەرگێڕە بەنیوبانگەکانی ئەو دەمە، یۆحەننا کوڕی پەتریق و، ئیبنۆل مۆقەفەع و حەجاجی کوڕی مەتەر و جونەین کوڕی ئیسحاق و جەوهەری.

(*٣) – چەند کارێکی بەجێبوو (شەرەفنامە) و(مێژووی کورد و کوردستان) و (مێژووی سلێمانی) و هەندێ لە بەرزترین ئەدەبیاتی کوردی وەرگێڕدرانە سەرزمانی عەرەبی. ئای چەند کەڵکێکی زۆری دەبوو ئەگەر بهاتایە بە ئینگلیزی و زمانە ئەوروپاییەکانیش وەربگیردرانایە، تا بێگانەکان بەڕاستی تێمانبگەیشتنایە و، لەخۆیانەوە گوللەیان بەتاریکییەوە نەنایە.

(*٤) – گۆڕینی ئەو پەرتۆکانەی رۆژهەڵاتناسەکان بەزمانە ئەوروپاییەکان نووسیویانە لەبارەی کوردەوە بەزمانی کوردی خزمەتێکی زۆر گەورەیە. هیوام وایە لاوە لێهاتووەکانمان نەیخەنە پشتگوێ.

(*٥) – گەورەترین زەحمەت کە لە وەرگێڕاندا دێتە رێی وەرگێڕ، ئەوەیە هەندێ لەو وشە و (مصطلحاتانە) ی لەزمانێکدا هەیە، لەزمانیکی دیکەدا بەرامبەریان نییە.

(*٦) – ئەکادێمیی – کۆمەڵی زمانەوانی، لە نامیلکەی (خوێندەواری بەزمانی کوردی) دا بەدووورودرێژی باسی ئەم ئەکادیمییەمان کرد.

(*٧) – هەندێ لەوانەی پێڕەویی ئەم رێگەیە دەکەن، دەڵێن: "دەبێ درێژیی رستە وەرگێڕدراوەکە بەقەد درێژیی رستەی دەقەکە بێ و، شوێنی دوا نوختەش لەهەردووکیاندا کوتومت وەکیەک بێ.

(*٨) – بۆ ئەوەی بەباشی لەمەدا سەرکەوی، دەبێ بەچاکی باسەکە بخوێنیتەوە و رستەی (میحوەری) تێدا بدۆزیتەوە، چۆنکە هەموو نووسینێک رستەیەکی تێدایە کە باسەکە بەدەوری ئەو رستەیەدا دەسووڕێتەوە.

(*٩) – (فیعل) لەهەموو رستەیەکدا وەک کلیلی ئەو رستەیە وایە و، هەتا مانای (فیعلەکە) نەزانیت ناتوانی لەمانای رستەکە بگەیت.

(*١٠) – بە لێکۆڵینەوەی خۆم دەرکەوتووەبۆم، کە وشەی "ماڵ" ی کوردی پێوەندیی بە "مال" ی عەرەبییەوە نییە. "ماڵ" ی کوردی لە "مار" ەوە هاتووە، کە "مار" و "وار" (بە مانای شوێنی لێژیان، نیشتمان) ە، دوو وێنەن بۆ یەک مانا. هەروەها وشەی "مار" بەشێکە لەوشەی "کۆمار" (کە لەعەرەبیدا کراوە بە جمهور)، سەرنجی پەرتۆکی "وشەنامەکی ئێتمۆلۆژیای زمانی کوردی" بدە لە ماڵپەڕی "کوردبوون" و، ماڵپەڕی "کۆنگرە" و، ماڵپەڕی "پەرتۆکی کوردی" دا.

(*١١) – ئەگەر تەماشایەکی ئەو چوار خشتەکییە فارسییانەی (خەیام) بکەیت کە (سەلام) بەهۆنراوە گۆڕیویەتە سەر کوردی و، بچیت ئەو وەرگێرانە بخوێنیتەوە کە بە هۆنراوە نەکراون، جیاوازییەکی زۆر دەبینی لەنێوانیاندا. هەر لەبەر ئەمەیە وەرگێڕانی چوارخشتەکییەکانی (خەیام) و ئەدیبە بەنێوبانگەکانی دیکە – بەهۆنراوە، گەلێ پەسندترە لەو وەرگێرانانەی کە لە شێوەی (پەخشان) دان.

(*١٢) – مەبەست لەوەرگێڕانی پەرتۆکی زانستی لەم پلەیەدا، تەنێ ئەوەیە زانست بکەوێتە سەرزمانی کورد. جا هەرچەندە وشەی بێگانەشی تێدابێ هەر قەیناکا، چۆنکە رۆژێک هەر دەبێ سەرەی بژارکردنیان بێ. بەڵام ئەوەی پێویستە بۆ ئیمڕۆ، بوونی ئەو شتانەیە بەزمانەکەمان. ئەگەرچی من لەوباوەڕەدام، زمانی کوردی سەرەڕای هەموو دواکەوتن و خزمەتنەکردنێک، بێتو بەم حاڵەش زانیاریی پێبنووسرێتەوە، ئەوەندەی فارسی و ترکی، وشەی بێگانەی تێناکەوێ. ئەو چەند بەرگ فیزیکەی نووسیومەتەوە بۆ قوتابخانە نێوەندییەکان، راستیی ئەم قسەیە

بۆ دۆست و دوژمن دەردەخات. مزگێنیش بێ بەم زووانە دەچنە ژێر چاپ و بۆ ساڵی داهاتوو لەبەردەستی قوتابیانی کوردستاندا ئامادەدەبن.

**سەرنج:**

**ئەم بەڵێنە هێنرایەدی، "سەرەتای جەبر" و، "سەرەتای میکانیک و خۆماڵەکانی مادە" چاپکران وبەخۆڕایی بەسەر قوتابیانی ئەو سەردەمەدا لە باشووری کوردستان، دابەشکران.**

(١٣*) — جاری واهەیە لەزمانی کوردیدا بۆ تاکە مانایەک چەند وشە هەن. ئەمەش سەبارەت بەوەیە کە زمانەکەمان بووەتە چەند شێوەیەکی جیاواز، بەهۆی باری رامیاری و بەرهەڵستی جوگرافیایی و نەبوونی تێکەڵیی لەنێوان دانیشتوانی کوردستاندا. لە نامیلکەی "خوێندەواری بەزمانی کوردی" دا، بەکورتی لێیدواین و لە پەرتۆکی (مەسەلەی زمان) دا بەدووروودرێژتر باسیدەکەین. زۆر کەسیش هەن، شانازی بەمەوە دەکەن و بە نیشانەیەکی دادەنێن بۆ دەوڵەمەندیی زمانی کوردی. راستییەکی دەولەمەندیی زمان لەوەدایە، بۆ هەر مانایەک وشەیەکی تایبەتیت هەبێ، نەک بۆ هێندەک مانا دە وشەت هەبێ و بۆ هێندەکی دیکە تاکە وشەیەکت لێ بچێتە قاتی.